# پاراستنی دەم و زوبان
# بەرامبەر
# موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خوای لیّ بێت)

حەمزە بەرزنجی

لەڕێی خوادا دەبەخشرێ و نافرۆشرێت

# دەستپێك

ان الحمدلله نحمده ونستعينه و نستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده وسوله....

زۆرن ئەوانەی لەمڕۆدا کەوتونەتە باس لە هاوەڵان و تانەو تەشەریان لیٚ ئەدەن، ئەو وەچە قورئانییە بیٚ وێنەیەی هەموو ژیانیان خستە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خاڵی ئیمانداران و فەقیهی ئەم ئوممەتە موعاویەیەی کوڕی ئەبو سوفیانە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) گەیاندنی پەیامەکەی، پێشتر تەنها ڕافیزەی دوژمن بە دین ئەوەی لیٚ دەبینرا، بەڵام ئەمڕۆ کەسانی کاریگەر بە فیکری بۆگەنی عەلمانییەت و دیموکراسییەت و بە بەرگ و ڕوواڵەتی ئیسلامەتییەوە ئەو کارە دەکەن.

زۆر دەمێکە دەمی بیٚ ئەدەبیان خستۆتە کارو کەسێك نییە لە حەپەیان بخات، کاتی ئەوەیە ئەو کەسانە بیٚ دەنگ بکرێن و وەك زانایان دەفەرموون

پێویسته بەخەڵكییان بناسێنرێت تا كەس تێكەڵیان نەبێت و بەو فیكرە نەخۆشە بارگاوی نەبێت.

یەكێك لەو هاوەڵە بەرێزانەش كە هەر لە كۆن و نوێدا كراوەتە ئامانجی تانە لێدان و كەمكرنەوەی رێزی هاوەڵ و كاتبی وەحی و ئەمینداری پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خاڵی ئیمانداران و فەقیهی ئەم ئوممەتە موعاویەیەی كوڕی ئەبو سوفیانە ڕەزای خوای لیٚ بێت.

ئەوانەشی كە بەرامبەر تێكڕای هاوەڵان ڕقن و دوژمنكارن سەرەتا لە موعاویەیەوە(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەست پیٚ دەكەن و دواتر دەكەونە قسە ووتن بە هاوەڵانی ترو لە كۆتاییشدا تۆمەت دەدەن پاڵ قورئان و ئەو وەحییەی ئەوان لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گەیاندوویانە.

هەر بۆیە عبد الله ی كوڕی المبارك(ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) فەرمویەتی: (معاوية عندنا محنة، فمن رأيناه ينظر إليه شزراً اتهمناه علي القوم، يعني الصحابة). البداية والنهاية١٣٩/٨.

واتە: موعاویە لای ئیمە تاقیکردنەوەو میحنەیە، جا هەرکەسێکمان بینی بە رق و دوژمنایەتیەوە تەماشای دەکرد ئەوا تۆمەتی دەدەینە پاڵ کە بەرامبەر هاوەڵانی تریش ڕقنە.

## فەزڵ و پایەی هاوەڵان(ڕەزای خوایان لێ بێت) بە گشتی

بێ گومان موعاویەیە(ڕەزای خوای لێ بێت) یەکێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە هەر دەقێك هاتبێت دەربارەی پلەو فەزڵی هاوەڵان ئەمیش دەگرێتەوە:

١-خوای گەورە لە چەندان ئایەتدا باس لە فەزڵی هاوەڵان دەکات، لەو ئایەتانە خوای گەورە دەفەرموێت: ( مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَي الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَي عَلَي سُوقِهِ

يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) ﴿ الفتح : ٢٩ ﴾ .

واتە: محمد(ﷺ) ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لەنێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنۆش و سوژدەدەبەن، هەردەم ئاواتیان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی و پایە بەرزی یە لەلای خوا، نیشانەی چاکی و پاکییان لەناوچەوانیاندا دیاریەو دەدرەوشێتەوە لەئەنجامی سوژدەبردن و خوا پەرستییاندا، جا ئەو بەرێزانە ئەوە نموونەو پێناسەیانە لەتەوراتدا، نموونەو پێناسەشیان لەئینجیلیشدا وەك ڕووەکێك وایە کە لە سەرەتاوە چەکەرەبکات، جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت، پاشان ئەستوور ببێت و ڕابوەستێت لەسەر قەدەکەی، ئەوەندە زوو پێ بگات کشتیارەکان سەرسام بکات و پێیان سەیر بێت: چۆن وا پێگەیی ؟! چۆن ئاوا خۆی گرت ؟! ئەم پێناسەیە بۆ ئەوەیە خوا کافران داخ لە دڵ بکات، جا خوای بەدەسەڵات بەڵێنی بەوانە داوە

که باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە لەوان: کە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورەو بێ سنووریان پێببەخشێت.

کە تەنیا ئەم ئایەتە کافییە دەربارەی فەزڵی هاوەڵان(ڕەزای خوایان لێ بێت).

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی هاوەڵە بەڕێزەکانی چەندان فەرموودەو فەرمایشتی هەیە، لەوانە:

٢- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ(ﷺ) ثُمَّ قُلْنَا: لَوْ جَلَسْنَا حَتَّي نُصَلِّيَ مَعَهُ الْعِشَاءَ، قَالَ: فَجَلَسْنَا" فَخَرَجَ عَلَيْنَا فَقَال: مَا زِلْتُمْ هَاهُنَا؟ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّيْنَا مَعَكَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ قُلْنَا نَجْلِسُ حَتَّي نُصَلِّيَ مَعَكَ الْعِشَاءَ، قَالَ: أَحْسَنْتُمْ، أَوْ أَصَبْتُمْ، قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَي السَّمَاءِ وَكَانَ كَثِيرًا مِمَّا يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَي السَّمَاءِ فَقَالَ: (النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ فَإِذَا ذَهَبَتْ النُّجُومُ أَتَي السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ، وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَي أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي

فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَي أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ). رواه مسلم (٢٥٣١).

واته: مەغریبێکیان نوێژمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بە جەماعەت کرد و پاشان ووتمان: باشتر وایە دانیشین هەتا نوێژی عیشاشی لەگەڵ دەکەین، ئیتر دانیشتین، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ ناومان و فەرمووی: هەتا ئێستا هەر لێرە ماون؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی مەغریبمان لەگەڵت کرد پاشان وتمان دادەنیشین هەتا عیشاشت لەگەڵ دەکەین، فەرمووی: چاکتان کرد، یان پێکاتان، فەرمووی: سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان کە عادەتی وابوو زۆرجار سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوەو فەرمووی: ئەستێرەکان نیشانەی پارێزراوی ئاسمانن ئەگەر ئەستێرەکان نەمان ئاسمان توشیی ئەو شتە دەبێت کە وەعد دراوە(کە قیامەتە)، منیش نیشانەی پارێزراوی هاوەڵانم، هەرکات من ڕۆیشتم و وەفاتم کرد هاوەڵانم توشی ئەو شتە دەبن کە بەڵێن دراوە، هاوەڵانیشم نیشانەی پارێزروای

ئوممەتمن، هەر كات هاوەڵانم نەمان ئوممەتەكەم توشی ئەو ناڕەحەتی و بەڵایانە دەبێت كە بەڵێن دراوە.

٣ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ(ﷺ): (لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ). رواه البخاري (٣٦٧٣) ، ومسلم (٢٥٤٠)

واتە: جوێن مەدەن بە هاوەڵانم، خۆ ئەگەر یەكێك لە ئێوە بە وێنەی شاخی ئوحد ئاڵتون ببەخشێت، ناگاتە ئەندازەی مشتێكی ئەوان و نیو مشتی ئەوان.
هەر بۆیە زانایان جوێندان و قسە ووتن بە هاوەڵانیان بە یەكێك لە تاوانە گەورەكان داناوە. شرح مسلم (٩٣/١٦).

٤– روي الحافظ الطبراني بإسناده إلي عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله(ﷺ): (لاتسبوا أصحابي، لعن الله من سب أصحابي). أورده الهيثمي في مجمع الزوائد (٢١/١٠) و رجاله رجال الصحيح . وحسنه الألباني بفظ: (لعن الله من سب أصحابي) عن ابن عمر، أنظر صحيح الجامع(٥١١١).

واتە: جوێن مەدەن بە هاوەڵەکانم..نەفرەتی خوا لە هەرکەسێك جوێن دەدات بە هاوەڵانم.

٥ – وروي أيضاً بإسناده إلي ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي(ﷺ) قال: (من سب أصحابي فعليه لعنة الله و الملائكة والناس أجمعين). أورده السيوطي في الجامع الصغير، وحسن إسناده الألباني في صحيح الجامع(٦٢٨٥) .

واتە: هەر کەسێك جوێنی دا بە هاوەڵانم لەعنەتی خواو مەلائیکەتو هەموو خەڵکی لەسەر بێت.

٦ – روي الطبراني من حديث عبدالله بن مسعود رضي الله عنه أن النبي(ﷺ) قال: (إذا ذكر أصحابي فأمسكوا). مجمع الزوائد (٢٠٢/٧). و صحح الألباني سنده في صحيح الجامع .

واتە: ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا (بەجۆرێك کە لایەق بەوان نەبوو)بیٚ دەنگ بن.

٧- عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال : قال رسول الله(ﷺ): (يَأْتِي عَلَي النَّاسِ زَمَانٌ فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنْ النَّاسِ فَيَقُولُونَ: فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ)؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي عَلَي النَّاسِ زَمَانٌ فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنْ النَّاسِ فَيُقَالُ: هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ(ﷺ)؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ. ثُمَّ يَأْتِي عَلَي النَّاسِ زَمَانٌ فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنْ النَّاسِ فَيُقَالُ هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ(ﷺ)؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ. فَيُفْتَحُ لَهُمْ). البخاري (٢/٢٨٧) ومسلم (٤/١٩٦٢)

واته: زەمانێك دێت بەسەر خەڵیدا كۆمەڵێك كەس دەچن بۆ غەزاو دەڵێن: ئایا كەستان تیایە هاوەڵێتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) كردبێت؟ دەڵێن: بەڵێ. ئیتر خوای گەورە فەتحیان بە نسیب دەكاتو ئەو شوێنە فەتح دەكەن، پاشان زەمانێك دێت بەسەر خەڵكیدا كۆمەڵێك كەس دەچن بۆ غەزاو ئەوترێت: ئایا كەستان تیایە هاوەڵێتی هاوەڵانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) كردبێت؟ ئەڵێن: بەڵێ، ئیتر خوای گەورە ئەو جێگایەیان بۆ فەتح دەكات، پاشان زەمانێك دێت بەسەر خەڵكیدا كۆمەڵێك

کەس دەچن بۆ غەزاو ئەوترێت: ئایا کەستان تیایە هاوەڵێتی هاوەڵی هاوەڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردبێت؟ ئەڵێن: بەڵێ، ئیتر خوای گەورە ئەو جێگایەیان بۆ فەتح دەکات.

٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ(ﷺ) قَالَ: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ....الحديث). البخاري (٢٦٥٢) ومسلم (٢٥٣٣) .

واتە: چاکترین کەسانی چەرخەکان ئەوانەی سەردەم و چەرخی منە پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن.

شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دوای باس کردنی ئەم فەرمودانە دەفەرموێت: (وهذه الأحاديث مستفيضة بل متواترة في فضائل الصحابة والثناء عليهم وتفضيل قرنهم علي من بعدهم من القرون، والقدح فيهم قدح في القرآن والسنة). مجموع الفتاوي (٤/٤٣٠)

.

واته: ئەم فەرمودانە یەجگار زۆر و بگرە متەواتیرن کە دەربارەی فەزڵی هاوەڵان و ستایش کردنیان و فەزڵدانی سەردەمی ئەوان بەسەر چەرخەکانی دوای ئەواندا هاتووە، وە تانەدان لێیان تانەدانە لە قورئان و سوننەت.

هەر بۆیە بە هیلاك چوو ئەو کەسەیە پێچەوانە دەوەستێت بەم هەموو هەڕەشەیەو قسە بە هاوەڵان دەڵێت.

هاوەڵان(ڕەزای خوایان لێ بێت) چاکترین کەسن دوای پێغەمبەران(علیهم الصلاه والسلام):

٩-هاوەڵی بەڕێز عبد الله ی کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (إن الله نظر إلي قلوب العباد، فوجد قلب محمد(ﷺ) خير قلوب العباد، فاصطفاه لنفسه فابتعثه برسالته، ثم نظر في قلوب العباد بعد قلب محمد(ﷺ)، فوجد قلوب أصحابه خير قلوب العباد، فجعلهم وزراء نبيه، يقاتلون علي دينه، فما رأي المسلمون حسناً فهو عند الله حسن، وما رأوا سيئاً

فهو عند الله سيء). المسند(١/٣٧٩) . و البغوي في شرح السنة (١/٢١٤-٢١٥) و هو حدث حسن

واته: خوای گەورە تەماشای دڵی بەندەکانی کرد بینی دڵی محمد(ﷺ) چاکترین دڵە لە ناویاندا، بۆیە هەڵی بژارد و پەیامەکەی پێدا نارد، پاشان تەماشای دڵی بەندەکانی کرد پاش محمد(ﷺ) بینی دڵی هاوەڵانی چاکترین دڵن، کردنیە وەزیری پێغەمبەرەکەی، لە پێناو دینەکەیدا دەجەنگان، ئەوەی موسڵمانان بە باشیان زانی لای خوای گەورە باش و چاکەو ئەوەی ئەوان بە خراپیان زانی ئەوە لای خوای گەورەش خراپە.

١٠- هاوەڵی بەڕێز عبد الله ی کوڕی عومەر((ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرمویەتی: (من كان مستناً فليستن بمن قد مات، أولئك أصحاب(ﷺ)، كانوا خير هذه الأمة، أبرها قلوباً وأعمقها علماً وأقلها تكلفاً، قوم اختارهم الله لصحبة نبيه(ﷺ)، ونقل دينه، فتشبهوا بأخلاقهم وطرائقهم، فهم أصحاب محمد(ﷺ) كان علي الهدي

المستقيم والله رب الكعبة). الحلية (١/٣٠٥ – ٣٠٦ ) . ومنهاج السنة ( ١/١٦٦ ) .

واته: هەرکەس دەیویست شوێن کەسێك کەوێت با شوێن ئەو کەسانە بکەوێت کە بە چاکەوە مردوون ئەوان هاوەڵانی محمد(ﷺ) بوون چاکترین کەسی ئەم ئوممەتە بوون، دڵیان لە هەموو کەس پاکترو لە هەموو کەس زانستیان قوڵترو کەمترین تەکەلوفیان لە خۆیان دەکرد، کەسانێك بوون خوای گەورە هەڵی بژاردبوون بۆ هاوەڵایەتی کردنی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و گەیاندنی دینەکەی، ئێوەش چاو لە ڕەوشت و ڕێگاکانیان بکەن، چونکە سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوانی هاوەڵی محمد(ﷺ) لەسەر ریگای ڕاستن.

# ووتەی پێشینان لەسەر تاوانی ناتەدان و قسە ووتن بە هاوەڵان:

ئیبن عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (لا تسبوا أصحاب (ﷺ)، فلمقام أحدهم ساعة يعني مع النبي(ﷺ) خير من عمل أحدكم أربعين سنة). رواه ابن بطة في شرح الإبانة (ص ١١٩) بإسناد صحيح.

واتە: جوێن مەدەن بە هاوەڵانی محمد(ﷺ)، چونکە یەك سەعات وەستانی ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) چاکترە لە چل ساڵ ئەنجامدانی کردەوەی چاکەی یەکێك لە ئێوە.

ئیمام مالکی کوڕی ئەنەس(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)فەرمویەتی: (الذي يشتم أصحاب رسول الله(ﷺ) ليس له سهم أو قال نصيب في الإسلام). شرح الإبانة لابن بطة (ص ١٦٢) .

واتە: ئەو کەسەی قسە بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێت: هیچ بەش و نصیبێکی نییە لە ئیسلام.

وه زۆرێك له زانایان جوێندان به هاوەڵان(ڕەزای خوایان لىٚ بێت) و تانەدان لێیان و له عەدالەتیان و دەرخستنی ڕق بۆیان به کوفر دادەنێن و خوێنی بکەرەکەی به حەڵاڵ دەزانن مەگەر تەوبه بکات. هەندێکی تر پێیان وایه کافر نابێت بەڵکو فاسق و گومڕایەو دەبێت به توندی سزا بدرێت و ئەدەب دابدرێت تا لەم کاره قێزەونه بگەڕێتەوە، بەڵام زانایانی ئەهلی سوننه تێکڕا یەکدەنگن لەسەر ئەوەی پێویستە لەسەرمان سینەمان ساف بێت بەرامبەریان و دەمی خۆمان بگرین له هەر کێشەیەك کاتی خۆی کەوتۆتە نێوان هاوەڵانەوە(ڕەزای خوایان لىٚ بێت). بڕوانة مجموع الفتاوي (٤٠٦/٣) و واللمعة ص١٧٥ لإبن قدامة المقدسي. والسير للإمام الذهبي١٠/٩٢-٩٣.

## فەزڵی موعاویە(ڕەزای خوای لیٚ بێت)

**١-پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوعای هیدایەتی بۆ کردووە:**

**عن عبد الرحمن بن أبي عميرة وكان من أصحاب رسول الله(ﷺ): عن النبي(ﷺ) أنه قال لمعاوية: (اللهم اجعله هاديا مهديا واهد به).** رواه الترمذي ( ٣٨٤٢ ) صححه الألباني :المشكاة ( ٦٢٣ ) ، الصحيحة (١٩٦٩)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە موعاویەیەی فەرموو: خوایە بیگێڕە لە هیدایەتدراوی هیدایەتدەر و هیدایەتی خەڵکی پیٚ بدە.**

**٢- پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوعای بۆ کردووە خوا لە سزا بیپارێزێت:**

**عن العِرباض بن سارية السلمي رضي الله عنه قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: "اللهم علّم معاوية الكتاب والحساب، وقِهِ العذاب** "رواه أحمد (١٧٢٠٢)، وصححه بشواهده الألباني في السلسلة الصحيحة ( ٣٢٢٧ ).

واتە: بیستم پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: خوایە موعاویە فێرە قورئان و حیساب بکەو لە سزا بیپارێزە.

٣- پێغەمبەری خوا(ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێ داوە:

عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ أَنَّ عُمَيْرَ بْنَ الْأَسْوَدِ الْعَنْسِيَّ حَدَّثَهُ أَنَّهُ أَتَي عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ، وَهُوَ نَازِلٌ فِي سَاحَةِ حِمْصَ، وَهُوَ فِي بِنَاءٍ لَهُ وَمَعَهُ، أُمُّ حَرَامٍ ، قَالَ عُمَيْرٌ: فَحَدَّثَتْنَا أُمُّ حَرَامٍ أَنَّهَا سَمِعَتْ النَّبِيَّ(ﷺ) يَقُولُ: أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ الْبَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا، قَالَتْ أُمُّ حَرَامٍ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا فِيهِمْ، قَالَ أَنْتِ فِيهِمْ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ(ﷺ): أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ مَغْفُورٌ لَهُمْ، فَقُلْتُ: أَنَا فِيهِمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، قَالَ: لَا). رواه البخاري (٢٩٢٤) .

واتە: یەکەم سوپایەك لە ئومەتەکەم کە غەزای دەریا دەکەن بەهەشتیان بۆ واجب بوو، ئوم حەرام فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەناویاندام؟ فەرمووی: تۆ لە ناویاندای. پاشان فەرمووی: یەکەم سوپایەك لە ئوممەتەکەم غەزای شاری قەیصەر (واتە قوستەنتینییە)

دەکەن خوای گەورە لێیان خۆش بووە، ووتم: من لەناویاندام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: نەخێر.

الحافظ ابن حجر(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (قَالَ الْمُهَلَّب: فِي هَذَا الْحَدِيثِ مَنْقَبَة لِمُعَاوِيَة لِأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ غَزَا الْبَحْرَ وَمَنْقَبَةٌ لِوَلَدِهِ يَزِيد لِأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ غَزَا مَدِينَةَ قَيْصَرَ ). الفتح (٦/١٢٠).

واتە: ابن الموهەلەب فەرمویەتی: لەم فەرمودەیەدا پلەو پایەی موعاویە دەردەکەوێت چونکە ئەو یەکەم کەس بوو غەزای دەریای کرد، وە پلەی یەزیدی کوڕی تیایە کە ئەو یەکەم کەس بوو غەزای شاری قەیصەری کرد.

إبن كثير(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (و قد كان يزيد أول من غزي مدينة قسطنطينية في سنة تسعٍ و أربعين في قول يعقوب بن سفيان، و قال خليفة بن خياط سنة خمسين. ثمّ حجّ بالناس في تلك السنة بعد مرجعه من هذه الغزوة من أرض الروم. و قد ثبت في الحديث أن رسول الله(ﷺ) قال: "أول جيش يغزو مدينة قيصر مغفور لهم". و هو الجيش الثاني الذي رآه رسول

الله(ﷺ) في منامه عند أمِّ حرَام فقالت: "ادع الله أن يجعلني منهم". فقال: "أنت من الأوّلين"، يعني جيش معاوية حين غزا قبرص ففتحها في سنة سبع و عشرين أيام عثمان بن عفان. و كانت معهم أم حرام فماتت هنالك بقبرص. ثم كان أمير الجيش الثاني ابنه يزيد بن معاوية، و لم تُدرِك أمَّ حَرَامٍ جيش يزيد هذا، و هذا من أعظم دلائل النبوة". البداية والنهاية٢٢٩/٨.

واته: يەزید یەکەم کەس بوو کە غەزای شاری قسطنطینیة ی کرد لە ساڵی ٤٩ بە لای ووتەی یەعقوبی کوڕی سوفیانەوە، وە خەلیفە بن خیاگ وتویەتی ساڵی ٥٠ بووە، وە هەر لەو ساڵەداو دوای گەڕانەوەی لەو غەزایەی لە خاکی ڕۆم حەجی بە خەڵك کردووە، وە لە فەرمودەدا چەسپاوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: یەکەم سوپا کە غەزای شاری قەیصەر دەکەن خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت، مەبەست بەمەش سوپای دووەمە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خەونیداو لای ئوم حەرام بینی و ئەویش فەرموی: دوعام بۆ بکە لەوان بم، ئەویش فەرموی: تۆ لە

یەکەمینەکانی، واتە لە سوپای موعاویەیەی کە غەزای قوبرصی کرد و ساڵی ٢٧ و لەسەردەمی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففاندا فەتحی کرد، چونکە لەو غەزایەدا ئەم حەرامیان لەگەڵ بوو هەر لەوێ لە قوبرص وەفاتی کرد، پاشان ئەمیری سوپای دووەم یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی بوو، بەڵام ئوم حەرام نەگەیشت بەم سوپایەی یەزید، ئەمەش لە گەورەترین بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتییە.

کەواتە دوو جار فەتحی شاری قەیصەر واتە (القسطنطينية) کراوە: جارێکیان ساڵی ٢٧ لەگەڵ موعاویە(ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێ ئیمامی عوسمان ئیزنی دا قوبرص فەتح بکرێت، موسڵمانانیش چونە ناوی. جاری دووەمیش ساڵی ٥٢ لە سەردەمی پاشایەتی و دەسەڵاتی موعاویەدا(ڕەزای خوای لێ بێت) یەزیدی کوڕی و سەربازەکانی نارد بۆ غەزوەی القسطنطينية.

وه موعاويه(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) له جاری یەکەمدا بۆ خۆی ئەمیرایەتی ئەو سوپایەی دەکرد./ انظر: تاريخ ابن جرير (٦٠١/٢)، وتاريخ دمشق لابن عساكر، والبداية والنهاية (٢٢٨/١٠) .

جگه لەمه موعاويه(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) له سەردەمی خۆیدا فەتحی چەندان شارو وڵاتی کردووەو بیست ساڵ خیلافەتی بەدەستەوە بووە.

ئیمامی الطبري(ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) له باسی ڕووداوەکانی ساڵی ٢٨ی کۆچی فەرمویەتی: (عن خالد بن معدان قال: أول من غزا في البحر معاوية بن أبي سفيان زمان عثمان بن عفان، وقد كان استأذن عمر فيه فلم يأذن له، فلما ولي عثمان لم يزل به معاوية حتي عزم عثمان علي ذلك بأخرة وقال: لا تنتخب الناس ولا تقرع بينهم خيرهم فمن اختار الغزو طائعا فاحمله وأعنه، ففعل). تاريخ الأمم والملوك ٦٠١/٢.

واته: له خالیدی کوری مەعدانەوە فەرمویەتی: یەکەم کەس که غەزای دەریاری کرد موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو له سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا، که

پێشتر داوای له عومەر کرد که هەستێت بەو غەزایە بەڵام ڕێگای نەدا، کاتیْ ئیمامی عوسمان بووە کاربەدەست بەردەوام موعاویە داوای لیْ کرد تا عوسمان بڕیاری داو فەرمووی: ئێمە کەسەکان هەڵنابژێرین بۆ ئەم کارە و قورعە ناکەین لە نێوانیاندا هەرکەس خۆی ویستی هەبوو بێت لەگەڵت تۆش هەڵی بگرەو بیبەو هاوکاری بکە، ئەویش وای کرد.

جا بە ئەمیر دانانی عومەر و عوسمان بۆ معاویە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر فەزڵی موعاویە(ڕەزای خوایان لیْ بێت).

٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنْ خَالَتِهِ أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ قَالَتْ: نَامَ النَّبِيُّ(ﷺ) يَوْمًا قَرِيبًا مِنِّي، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ يَتَبَسَّمُ، فَقُلْتُ: مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: أُنَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ يَرْكَبُونَ هَذَا الْبَحْرَ الْأَخْضَرَ كَالْمُلُوكِ عَلَي الْأَسِرَّةِ. قَالَتْ: فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَدَعَا لَهَا، ثُمَّ نَامَ الثَّانِيَةَ، فَفَعَلَ مِثْلَهَا، فَقَالَتْ مِثْلَ قَوْلِهَا، فَأَجَابَهَا مِثْلَهَا. فَقَالَتْ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: أَنْتِ مِنْ الْأَوَّلِينَ.

فَخَرَجَتْ مَعَ زَوْجِهَا عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ غَازِيًا أَوَّلَ مَا رَكِبَ الْمُسْلِمُونَ الْبَحْرَ مَعَ مُعَاوِيَةَ، فَلَمَّا انْصَرَفُوا مِنْ غَزْوِهِمْ قَافِلِينَ، فَنَزَلُوا الشَّأْمَ، فَقُرِّبَتْ إِلَيْهَا دَابَّةٌ لِتَرْكَبَهَا، فَصَرَعَتْهَا فَمَاتَتْ) صحيح البخاري٧/٢١٤ برقم(٢٧٩٩)و (٢٨٠٠) بَاب فَضْلِ مَنْ يُصْرَعُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمَاتَ فَهُوَ مِنْهُمْ وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَي {وَمَنْ يَخْرُجْ مِنْ بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَي اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَي اللَّهِ} وَقَعَ وَجَبَ. ومسلم (١٩١٢)

واته: ئوم حەرام فەرمویەتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نزیك منەوە نوستبوو پاشان بە زەردەخەنە کردنەوە هەستا، ووتم: بەچی پێدەکەنیت؟ فەرموی: بە کۆمەڵە کەسانێك لە ئوممەتەکەم کە لە خەونمدا نیشانمدران ئەوان لەم دەریا سەوزەدا سورای کەشتی بووبوون وەك پاشا بەسەر تەختەکەیەوە، ووتم: دوعام بۆ بکە من یەکێك بم لەوانە، ئەویش پاڕایەوە بۆی، پاشان نوستەوەو هەمان شتی کردەوە و ئەمیش هەمان پرسیاری لێ کردو ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە، فەرموی: دوعام بۆ بکە یەکێك بم لەو کەسانە، فەرموی:

تۆ لە یەکەمەکانی، ئوم حەرام لەگەڵ عوبادەی کوڕی صامتی مێردیدا لەسەردەمی موعاویەدا لەیەکەم وەجبەی موسڵمان کە چوونە دەریا دەرچوون بۆ ئەو غەزایە، کاتیَ لە غەزاکە گەڕانەوەو گەیشتنە شام وڵاغێکی بۆ ئامادەکرا تا سەربکەوێت، وڵاغەکە خستیە خوارەوەو وەفاتی کرد.

٥- عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: أَوْتَرَ مُعَاوِيَةُ بَعْدَ الْعِشَاءِ بِرَكْعَةٍ وَعِنْدَهُ مَوْلًي لِابْنِ عَبَّاسٍ، فَأَتَي ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: (دَعْهُ" فَإِنَّهُ قَدْ صَحِبَ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ)). رواه البخاري (٣٧٦٤).

واتە: ڕۆژێکیان دوای عیشا موعاویە بە یەك ڕکات ویتری کردو خزمەتکارێکی ئیبن عەباسیشی لە لادا بوو، ئەویش گەڕایەوەو ئەمەی بۆ ئیبن عەباس باس کرد، ئیبن عەباس(ڕەزای خوای لیَ بێت) فەرموی: وازی لیَ بهێنە ئەو هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردووە.

وَعَنْ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ قِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: هَلْ لَكَ فِي أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ مُعَاوِيَةَ؟ فَإِنَّهُ مَا أَوْتَرَ إِلَّا بِوَاحِدَةٍ، قَالَ: أَصَابَ، إِنَّهُ فَقِيهٌ. رواه البخاري (٣٧٦٥).

واته: به ئیبن عەباس وترا: ئاگات له ئەمیری ئیمانداران موعاویه هەیه؟ ئەو تەنها به یەك ڕكات نوێژ ویتر دەكات، فەرموی: پێكاویەتی، ئەو فەقیهە.

٦- عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ لِي مُعَاوِيَةُ: أَعَلِمْتَ أَنِّي قَصَّرْتُ مِنْ رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ(ﷺ) عِنْدَ الْمَرْوَةِ بِمِشْقَصٍ، فَقُلْتُ لَهُ: لَا أَعْلَمُ هَذَا إِلَّا حُجَّةً عَلَيْكَ. رواه البخاري (١٣٧٠) ، ومسلم (١٢٤٦) واللفظ له .

واته: ئیبن عەباس فەرمویەتی: موعاویه پێی ووتم: ئایا تۆ زانیوته من له لای مەروه به نوكی تیر موی سەری پێغەمبەری خوام(ﷺ) كورت كردۆتەوه؟ منیش پێم ووت: من پێم وایه ئەمه بەڵگەیەكه لەسەر تۆ (مەبەستی ئیبن عەباس لەم بەشەی وتەكەی دوای قسەو باسێك بووه لەسەر بابەتێكی شەرعی كه تیایدا

ئیختیلافیان هەبووە کە ئەویش بریتی بووە لە بابەتی تەحەللول کردن لە حەج وعومرە).

وە چەندان فەرمودەی تر هەیە لە بارەی فەزڵی موعاویە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت)

## وتەی زانایان دەربارەی موعاویە(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت)

١-سئل عبد الله بن المبارك، أيهما أفضل: معاوية بن أبي سفيان، أم عمر بن عبد العزيز؟ فقال: و الله إن الغبار الذي دخل في أنف معاوية مع رسول الله(ﷺ) أفضل من عمر بألف مرة، صلي معاوية خلف رسول الله(ﷺ)، فقال: سمع الله لمن حمده، فقال معاوية: ربنا ولك الحمد. فما بعد هذا؟ أخرجه ابن خلكان في "وفيات الأعيان" (٣٣/٣) ، و بلفظ قريب منه عند الآجري في " الشريعة " (٢٤٦٦/٥) .

واتە: پرسیار کرا لە عبداللە ی کوری موبارەك: کامیان باشترن: موعاویەی کوری ئەبی سوفیان یان عومەری کوری عبدالعزیز؟ ئەویش فەرموی: سوێند بە خوا ئەو تۆزەی چۆتە لوتی موعاویەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هەزار جار باشترە لە عومەر، موعاویە لە پشت پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نوێژی کردووەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: سمع الله لمن حمده، موعاویەیەش فەرمویەتی: ربنا ولك الحمد، چی تر هەیە دوای ئەمەو لەمە باشتر بێت؟

٢ – عن الجراح الموصلي قال: سمعت رجلاً يسأل المعافى بن عمران فقال: يا أبا مسعود" أين عمر بن عبد العزيز من معاوية بن أبي سفيان؟! فرأيته غضب غضباً شديداً و قال: لا يقاس بأصحاب محمد(ﷺ) أحد، معاوية رضي الله عنه كاتبه و صاحبه و صهره و أمينه علي وحيه عز وجل . أخرجه الآجري في " الشريعة " (٥/٢٤٦٦) ، واللالكائي في " شرح السنة " (٢٧٨٥) وسنده صحيح

واته: گوێم له‌ پیاوێك بوو پرسیاری له‌ المعافى بن عمران ده‌كردو ده‌یووت: ئه‌ی باوكی مه‌سعود پله‌ی عومه‌ری كوری عبدالعزیز له‌ چاو موعاویه‌یه‌ی كوری ئه‌بی سوفیاندا له‌ كوێدایه‌؟ بینیم زۆر تووڕه‌ بوو فه‌رمووی: هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) قیاس ناكرێن به‌ هیچ كه‌س، موعاویه‌(ڕه‌زای خوای لێ بێت) نوسه‌ری وه‌حی و هاوه‌ڵ و خزم و نزیك و ئه‌مینی پێغه‌مبه‌ر بووه‌(ﷺ) بۆ نوسینه‌وه‌ی وه‌حی خوای گه‌وره‌.

هه‌مان پرسیاریش له‌ ئه‌بی ئوسامه‌ كراو ئه‌ویش فه‌رمووی: هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) قیاس ناكرێن به‌ هیچ كه‌س/ أخرجه الآجري في " الشريعة " (٥/٢٤٦٥) ، والخلال في " السنة " (٦٦٦) بسند صحيح .

٣ – سئل الإمام أحمد: ما تقول رحمك الله فيمن قال: لا أقول إن معاوية كاتب الوحي، ولا أقول إنه خال المؤمنين فإنه أخذها بالسيف غصباً؟ قال أبو عبد الله: هذا قول سوء رديء، يجانبون هؤلاء القوم، ولا

**يجالسون، و نبين أمرهم للناس.** أخرجه الخلال في " السنة " (٤٣٤/٢) بسند صحيح .

**واته: پرسيار كرا له ئيمامى ئه‌حمه‌د: ڕه‌حمه‌تى خوات لىٚ بێت چى ده‌ڵيت ده‌رباره‌ى كه‌سێك ئه‌ڵێت: من ناڵێم موعاويه نوسه‌رى وه‌حى بووه و ناڵێم ئه‌و خاڵى ئيمانادرانه، چونكه ئه‌و به زۆرو شمشێر ده‌سته‌ڵاتى گرتووه؟ ئه‌بو عبدالله فه‌رمووى: ئه‌مه قسه‌يه‌كى يه‌جگار خراپ و بۆگه‌نه، ده‌بێت ئه‌و جۆره كه‌سانه خۆيان لىٚ به دوور بگيرێت و له‌گه‌ڵيان دانه‌نيشن و ئه‌و سيفاته‌شيان بۆ خه‌ڵك ڕوون بكرێته‌وه.**

**٤-يه‌كێكى تر له تايبه‌تمه‌نديه‌كانى موعاويه به‌سه‌ر خه‌ليفه‌كانى دواتردا ئه‌وه‌يه چه‌ندان هاوه‌ڵى پێغه‌مبه‌رى خوا(ره‌زاى خوايان لىٚ بێت) به‌يعه‌تيان پىٚ داوه:**

**ابن حزم (ڕه‌حمه‌تى خواى لىٚ بێت) فه‌رمويه‌تى: (فكلهم أولهم عن آخرهم بايع معاوية ورأي إمامته).** الفصل٦/٥.

واته: سەرجەمیان یەکەمیان تا کۆتا کەسیان بەیعەتیان بە موعاویە داو پێیان وا بوو پێشەوای موسڵمانانە.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (فَإِنَّ مُعَاوِيَةَ ثَبَتَ بِالتَّوَاتُرِ أَنَّهُ أَمَرَهُ النَّبِيُّ(ﷺ) كَمَا أَمَرَ غَيْرَهُ وَجَاهَدَ مَعَهُ وَكَانَ أَمِينًا عِنْدَهُ يَكْتُبُ لَهُ الْوَحْيَ وَمَا اتَّهَمَهُ النَّبِيُّ(ﷺ) فِي كِتَابَةِ الْوَحْيِ. وَوَلَّاهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ الَّذِي كَانَ مِنْ أَخْبَرِ النَّاسِ بِالرِّجَالِ وَقَدْ ضَرَبَ اللَّهُ الْحَقَّ عَلَي لِسَانِهِ وَقَلْبِهِ وَلَمْ يَتَّهِمْهُ فِي وِلَايَتِهِ). مجموع الفتاوي٤/٤٧٢.

واته: چەسپاوە کە موعاویە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کردویەتییە ئەمیر وەك چۆن غەیری ئەوی کردووە، وە جیهادی کردووە لەگەڵیدا، وە ئەمیندار بووە لە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و نوسەری وەحی بووەو هەرگیز پێغەمبەری خوا(ﷺ) گومانی نەیبووە لێی لە نوسینەوەی وەحیدا، داتریش ئیمامی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) کردویەتییە والی کە شارەزاترین کەس

بووه به پیاوان و خاوی گەوره حەقی لەسەر زمان و دڵی داناوەو ئەویش بە گومان نەبووه له ویلایەتەکەی.

ئیمام أبو نعيم الأصبهاني له باسی ژیانی موعاویەدا(ڕەزای خوای لیٚ بێت) فەرمویەتی: (كان من الكتبة الحسبة الفصحة، أسلم قبيل الفتح، وقيل عام القضية وهو ابن ثمان عشرة، وعده ابن عباس من الفقهاء، قال: كان فقيهاً ..) معرفة الصحابة٥/٢٤٩٦.

واتە: یەکێك بووه له کاتب و فەرمان بەچاکەکاره زمان پاراوەکان، پێش فەتحی مەککە موسڵمان بووه، وه وتراوه ساڵی (القضية) موسڵمان بووەو ئەو کات تەمەنی هەژده ساڵان بووه، ئیبن عەباسیش بە یەکێك له فەقیهەکانی داناوەو فەرمویەتی: موعاویە فەقیه بووه..

ابن حجر الهيتمي(ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) فەرمویەتی: (ومنه فوزه (ﷺ)، فإن أم حبيبة أم المؤمنين رضي الله عنها أخته ..). تطهير الجنان ( ص ١٧ – ١٨ )

واتە: له فەزڵەکانی موعاویە بریتییە لەوەی پلەی خزمایەتی نزیکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) پیٚ بڕاوه،

چونكە ئوم حەبیبەی دایكی ئیمانداران خوشكی موعاویەیە.

ابن قودامەی مەقدیسی(ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) فەرمویەتی: (ومعاوية خال المؤمنين، وكاتب وحي الله، وأحد خلفاء المسلمين رضي الله تعالي عنهم). لمعة الاعتقاد (ص ٣٣) ..

واتە: موعاویە خاڵی ئیماندارانە، وە نوسەری وەحی خوایە، وە یەكێكە لە خەلیفەكانی موسڵمانان(ڕەزای خوا لە هەموویان بێت).

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە(ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) فەرمویەتی: (واتفق العلماء علي أن معاوية أفضل ملوك هذه الأمة، فإن الأربعة قبله كانوا خلفاء نبوة، وهو أول الملوك، كان ملكه ملكاً ورحمة). مجموع الفتاوي٤/٤٧٨.

واتە: زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی موعاویەیە چاكترین پاشایانی ئەم ئوممەتەیە، چونكە چوار خەلیفەكەی پێش ئەو خەلیفەكانی پێغەمبەر بوون(ﷺ)، ئەویش یەكەمین پاشایە، پاشایەتییەكەشی ڕاستەقینەو پڕ لە سۆز و بەزەیی بووە.

وه ئیبن کثیریش(ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) فەرمویەتی: (وأجمعت الرعايا علي بيعته في سنة إحدي وأربعين .. فلم يزل مستقلاً بالأمر في هذه المدة إلي هذه السنة التي كانت فيها وفاته، والجهاد في بلاد العدو قائم وكلمة الله عالية، والغنائم ترد إليه من أطراف الأرض، والمسلمون معه في راحة وعدل وصفح وعفو). البداية والنهاية (١١٩/٨) .

واتە: سەرجەم خەڵك و ژێر دەستەکانی یەکدەنگ بوون لەسەر بەیعەت دان پێی لە ساڵی ٤١دا..بەردەوام هەمو ئەو ماوەیە بە تەنها خۆی کاربەدەست بوو تا ئەو ساڵەی تیایدا وەفاتی کرد، جیهادیش لە شارو وڵاتانی دوژمنیش بەردەوام بوو ووشەی الله بەرز ڕادەگیراو غەنیمەتەکان لە هەموو لایەکی زەوییەوە دەگەڕێنرایەوە بۆ و موسڵمانانیش لەگەڵی لە خۆش و دادپەروەری و لێبوردەیی و چاوپۆشیدا بوون.

وه دەفەرمویٚت: (كان حليماً وقوراً رئيساً سيداً في الناس، كريماً عادلاً شهماً). البداية١١٨/٨.

ئەو زۆر بە حیلم و خاوەن هەیبەت و سەردار و سەرۆك بوو لە ناو خەڵكدا، بەخشندەو دادپەروەر و بوێرو ئازا بوو.

ابن أبى العز الحنفى(ڕەحمەتى خواى لىٚ بێت) فەرمويەتى: (وأول ملوك المسلمين معاوية وهو خير ملوك المسلمين). شرح العقيدة الطحاوية ( ص ٧٢٢ ) .

واتە: یەكەم پاشاى موسڵمانان موعاویەیە بوو كە چاكترین پاشاى موسڵمانانە

ئیمامى الذهبي (ڕەحمەتى خواى لىٚ بێت) دەفەرموێت: (أمير المؤمنين ملك الإسلام). السير (٣/١٢٠) .

واتە: ئەمیرى ئیمانداران و پاشاى ئیسلام بوو.

## له كۆتاییدا..

هاوەڵانی خۆشەویست(ڕەزای خوایان لێ بێت) سۆمای چاوانمانن و ئەبێت لای هەموومان هێڵی سوور بن..پێویستە خۆشویستن و بەرگری کردن لێیان بە دینداری بزانین و بە هیچ جۆرێك بوار بە هیچ نەفام و کاڵفام و نەخوێندەوارێك نەدەین بیەوێت لەکەداریان بکات..

کێ ئەتوانێت ئەوان لەکەدار بکات لە کاتێکدا خوای گەورە خۆی شایەتی چاکی و پاکی بۆ داون..؟

کێ ئەتوانێت لە پلەیان کەم کاتەوە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ئەمیندارو پلە بەرز باسی کردوون؟

تانەدان لەوان..تانەدانە لە خۆشەویستانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)..

خوای گەورە لە هاوەڵان ڕازی بەو پلەیان بەرز بکەرەوەو تەوفیقمان بدە لەسەر ڕێگاکەی ئەو بڕۆین و لە قیامەتدا بە خزمەتی ڕوخساری نورینی ئەو کەڵە پیاوانەمان شاد بکە...